# نەنە

## چەپکە شیعرێکە بۆ منداڵان

ئەم بەرهەمە پێشکەشە
بەهەموودایکان و منداڵانی کوردستان
و

پێشکەشە بە دایە گێلاس
پێشکەشە بە دایکی سیما و سۆلین

ئاکۆ مەحەمەد سابیر

پێشکەشە بە خۆشەویستانی
پالیز و ئاریز
بابە عەلی و بابە فایەق

شکۆ عەلی عەسکەری

# نەنە

## چەپکە شیعرێکە بۆ مناڵان



## پێشەکی

## نە نە

**موحسین جوامێر**

( نە نە) چەپکە شیعرێکە و لە نووسینی برای بەڕێز کاك ئاکۆ- یە.. رشتەیەکە لە مرواریی شیعری ناسك و جوان لەبەردڵ و دیدی منداڵی کورد و ئاسانیش لەسەر زمانی وان.

وەکوو وێدەچێ کاك ئاکۆ لە کوردستانیش بەرهەمی بۆ کۆرپەی کورد نووسیوە.پێشم وابێ بوونی لە سویدا، دەرفەتێکی پربایەخە بۆ گەشەپێدانی خوی لەم بوارەدا، چ لەڕووی ناسینی منداڵ لە ڕوانگەی پەروەردە و زانستەوە، چ لەڕووی تەکنیکیی شیعرەویش کە هەردووکیان لە لووتکەی گرنگی دان بۆ سەرکەوتنی هەر بەروبەرهەمێک کەپێشکەشە بە منداڵان دەکرێن.

من وەك مامۆستایوك، شیعرەکانم هەموو بەدەنگ خوێندەوە، بێگرێوگۆڵ بوون، ئەمەم لەلا گرنگ بوو.. هەستم کردنێوەڕۆکەکانیش بە پێز بوون و وایش بزانم لەگەڵ کەش وهەوای زارۆکانی هەندەرانیش نامۆ نین.. گرگدانی منداڵی کوردیش لە ڕێگەی شیعر و لە هەر کوێیەك بن، بە کوردستانەوە، خاڵیکی هەرە گرنگە و دەچێتە پاڵ پاراستنی ناسنامەی نەوەکانمان کە لەگەڵ ئاڕاستەی پەروەردەو بۆچوونی وڵاتانی ئەوڕووپیش کۆك و تەبایە.

هیواخوازم منداڵی کورد بە خوێندنەوە و گوتنەوەی شیعرەکانی دووتوێی ئەم نامێلکەیە، دڵگەش و زمانپاراو بن.. مامۆستایانیش، بیانکەن بە سەرچاوەیەك لە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردندا!

سەرکەوتنی کاك ئاکۆیش، ئەویەری ئاواتمانە.

# نەنە

تـەق تـەق تـەق تـەق

گوێم لــە دەنگی دەرگـایـە
من بیـکـەمـەوە دایـــە ؟

ئـا ئـا گوڵـەکـــەم ڕاکــە
بیکـەرەوە خـــێراکـــە

مژدە مژدە نـەنـە یـــە
چارۆکـە کـەشی پێ یـــە

پڕە لـە نـوقڵ ومـــیوە
ئـەڵێت بۆ تـۆم کــــڕیوە

سووپاس نەنەی ڕووخۆشم
بـە هـاتنت دڵـخۆشـــــم

ئـــەمڕۆ هاتویت بۆ مـاڵمان
وەك جـەژن وایــــە لامـان

نـەنـە دنیـــای زۆر دیـوە
لـە دوای شەوچەرە و میوە

چیـرۆکی گـورگ و بـــزن
ئـــەگێڕێتـە وە بـــۆ من

دەست بـــە سەرما ئە هێنێت
لــــەلای خۆی ئەمخـەوێنێت

# سۆلین



منداڵێـکی شـەش ساڵم
بچـکۆلانـەکەی مـــاڵم

دڵـخۆش و شـــادومانم
ئەمســاڵ منیش ئەتوانم

بـڕۆم بۆ قوتـابخـــانە
دەمێــکە چـــاوەڕوانم

بـەجوانی خـۆم ئـەگۆڕم
جـانتـا ئـەکـەمـە شـانم

لـەوێ خـۆم ئـەنـاسێنم
بـە هـاوڕێ تـازەکــانم

یاری وفیـکلانکۆ ئەکەم
لـەگـەڵیـان تـائەتـــوانم

گـوێڕایـەڵ و ژیر ئـەبم
لـەکـاتی وانـەکـــانـــم

لەسەر تەختەی پۆلەکەم
بـە پـەنـجە وردەکـــانـم

فێرئـەبـم و ئـــەنووسم
خـۆشمەوێـت کوردستانم

# چۆلەکە و هێشوو

چۆلـەکە یـــەکی مـاندوو
نیشتـەوە لـــەلای هێشوو

هێشوو کیژێـــکی جوانە
هـاورێ ی باڵنـدەکـــانە

وتـــی ها چۆلەکەی جوان
بـاڵندەی نـــەرم و نیـــان

بـۆ شپـرزە وشێـــواوی
ئــەوە کـــێ ڕاوی نـاوی

چۆلـەکـە وتــی هــاورێم
تینـووم بۆ ئـاو ئەگەڕێم

ڕۆیشت بــە پـەلـــە زوو
ئـــاوی بۆ هێنـــا هێشوو

تێـــر ئـاو بوو گەشایـەوە
دڵ خۆش بـوو بوژایـــەوە

ئـاوەکە زۆری مــــابوو
ویستـــی بیرێژێت هێشوو

بـەهـاتریـن سـامـانـــە
سـەرچـاوەی ژیـانـمانـە

هێشوو زۆر سوپاسی کرد
ئامۆژگـاریەکەی وەرگرت

نـەی ڕشت بـەفیرۆی نەدا
نـەمـــامێـکی پـێ ئـاودا



# بوکەکەم

وس بن وس بن بێدەنگ بن
خـەوتووە بووکـەکـەی من

ئـەمڕۆ زۆر زۆر مـاندووە
یـاریمـان زۆر کـــردووە

پـاڵم خستـووە لـە لانـکە
بۆی ئـەهۆنـم ملوانـــکە

گوڵم داوە لـە ســـەری
جـوانـە هـەروەکـو پـەری

قژیشی زەرد و لـوولــە
جــوانـە وەکـو پـەپوولــە

ئـەە ئـەە چـەند خۆشم ئـەوێت
قـەزای لـەماڵم کـــەوێت

هـەردوو گـۆنـای مـاچ ئـەکـەم
لایـلایـەشی بـۆ ئـەکـــەم

دەی دە وس بن بێدەنــگ بن
بـا خـەوی نـەزڕێت خــرپن



# دەستەکانم

سەیری دەستەکانم ئەکەم
بۆ من نە زیادن نە کەم

دە پەنجەن بە یەکسانی
کار ئەکەن بە ئاسانی

هاوکارن لە کارکردن
بە بێ جیاوازی کردن

وێنەیان پێ ئەکێشم
نەمامیان پێ ئەنێژم

زۆر بەنرخ و بەڕێزن
خاوێنیم ئەپارێزن

ئەوکاتە دڵخۆش مەکەن
یارمەتی خەڵکی ئەدەن

دەستی هاوڕێکەم ئەگرم
لەخۆشی دا باڵ ئەگرم

بەختەوەر و ئاسودەم
چەپڵەیان پێ لێ ئەدەم

# ددانەکانم



من خــــاوێنـــی ددانــــم
پێویستـە بـــــاش بزانـــم

بــە فڵچــە و دەرمــانی خۆم
شەو و ڕۆژ دووجار ئەیشۆم

یـەکمجــار لـەپێش خــەوتــن
بـــەیانیش پاش نان خواردن

گـــەر بێت و بیــــرم بچێت
ددانــم خــــراپ ئــــــەبێت

مــــــکرۆب وئـــازارو ژان
گـــوپمـەکـەن بــە میزڵــــدان

ئــای لـــە ژانـــی دان ئێشـــە
هــەتــا بڵێ ی نــــــاخۆشه

هـــاوڕیێ یـان وەکـو من بن
با ددانتـــــان ڕەش نــــــەبن

سپـی و درشتــــــــە دانــم
خــــــاوەن فڵچـە و دەرمانم

# بەیانی و بەفر



بــەیـانی لــە خەو هەستام
ڕۆژێـکی خـۆش بـوولەلام

پـەردەی پەنجــەرەم لابرد
دڵـخۆش بووم هــاوارم کرد

هێی هێی بەفری سپی جوان
بووە بـە بـەرگی کـــۆڵان

ڕامـکرد خێـرا دەست و برد
جلـەکـــانم لـــە بـــەرکرد

پـــاڵتۆ و بـلووزی گـــەرم
پووت ودەســت کێشی چەرم

بـە پـەلــە چــووم بۆ کۆڵان
دروستــم کـرد شتی جــوان

یــەك شێـرەبــەفرینەی زل
مل پێچیشـم کـــــردە مل

هـەڵمـاتم کــرد بـــەچاوی
بــرۆی پـــەڕی مـراوی

مۆزێـکم کرد بــە دەمـــی
وادیـــار بـوو پێئـەکـەنی

کـــڵاوێــکم کردە ســـەر
لووتـم بۆ کـرد بـە گـوێزەر

تـەنهـا سێ ڕۆژ مـایـــەوە
خـۆر لێیـــدا تـــوایـەوە

# ژینگە

ئەم باخچە و کانی و ئاوە
سەیریکەن چەند ڕازاوە

بۆن و بەرامی خۆشی
عەتر و گوڵاو ڕژاوە

چیمەن و گوڵ تێکەڵاو
ئەڵێی فەرشە چنراوە

بەرسیلەی تازە وناسك
شۆڕبۆتەوە لە لاسك

شنە بای دڵ فڕێنە
خۆشترین باوەشێنە

کانیەکەی هێندە ڕوونە
زیخ و چەوی ئاڵتونە

سەیری کە وەك ئاوێنە
قژی لەبەر داهێنە

ئای لە بێگەردی و پاکی
هاوڕێ یەکی چالاکی

زۆر سوپاس بۆ تۆی بەڕێز
هاووڵاتی ژینگە پارێز

با هەموو بە دڵسۆزی
وڵات جوانکەین بەسەوزی



# خونچە



من کە نـاوم خونچەیە
وولاتەکەم باخچەیە

هاوڕێی من پەپولەیە
هەنگە و خاڵخاڵۆکەیە

چاوەکانم هەڵدێنم
پەیامی بەهار دێنم

بەڕەنگی جوان بۆنی خۆش
پەپوولە ئەکەمە کۆش

ئەڵێم هەنگی ئازیزتۆش
شیلەی شیرین بکە نۆش

خاڵخاڵۆکە تۆش وەرە
دەستمان بگرە و هەڵپەڕە

منداڵانی کوردستان
ئێوەش خونچەن هەمووتان

کوردستانیش باخچەیە
دڵگیرترین ناوچەیە

ئێمە و ئێوە پێکەوە
جوان ئەیڕازێنینەوە

ئەیکەین بەو گوڵستانە
کە ئاواتی هەموانە

# ئێمەی منداڵ

پـێ ئــەکـەنین دڵ خـۆشین
خنجیلانـــە و ڕووخـۆشین

پـــەپوولـەین ئێسك سوكین
نـەشمیلانـــە و بچوكیـن

زیت و وریـــاو نیـانیـن
دیـاری خوای میهـــرەبانین

بـە ئـاسانی و ئـاسـایی
ئـەكـەینـەوە لاسـایی

پشیلـەمـان دی بەچـاو
یەكسەر پێ ی ئەڵێن میـاو

وەك سمـۆره بـــاز ئەدەین
یاری خۆش خۆش سازئەكەین

یـان ورچین بـە بۆڵـە بـۆڵ
یـەكتری ئـەكـەینـە كـۆڵ

بــەیـانی تـــا ئێـواری
خـــەنـدەمـان لێ ئەباری

گـوڵیـــن بێ گەردین جوانین
داهـاتـــووی كوردستانین



# زەنگۆڵە

باع باع بەرخۆلە
وەك خۆم جوان وبچكۆلە

هاتم بۆ لات نەرمۆڵە
بۆم هێناوی زەنگۆڵە

ئێستا ئەیكەمە ملت
گەردنی نەرم وشلت

بە زەنگۆڵەوە جوانە
تووك سپی خنجیلانە

دەی با بڕۆین خێراكە
وەرە و بەدواما ڕاكە

تا ببینن بزانن
زەنگۆڵەكانت جوانن



# باران



جــوانـــــه دڵــۆپەی باران
دێتــه خــوارێ لــه ئــاسمان

مـــاچ ئــەكات لێـوانی گـوڵ
بۆن خۆش ئەكات خاك و گـڵ

وەكـو دایـكێـكی بــــــەسۆز
ئــەخـــەوێـنێت تــەپـو تـۆز

زۆر ئـــــەكـــات ئاوی ڕوبار
بــەرز ئـەكــات بــاڵای چنار

كــه بـەلێزمـه دێتـه خــــوار
پـــاك ئـەشوات شەقامی شار

لــه مێژه زەوی و ئـــاسمان
هەور و هەوا و دەریای جوان

لــه گــەڵ ئــەو خـۆره گەشه
كــاركـردنیــان هـــاوبەشه

# یاسا

سەر هەڵئـەبڕم بۆ ئاسمان
بەدی ئەکـەم یاسای جوان

مانگ و خـۆر و ئەستێرە
زەویش بەشـــدارە لێــرە

منیش ئـــــــادەمیزادم
یـــاســـای پێویستە کاتم

خـەو، خـواردن، هاتوچۆ
کـاتی سـەردان، گفتوگۆ

خوێندن و وەرزش کردن
هەمـوو پێویستـن بـۆ مـن

خشتـەم دانـاوە بۆ کــــات
ئـەرکەکان دابەش ئـەکات

تـا هـەمووی بـە چالاکی
جێ بەجێ کەم بە چــاکی

هەموو یاسا پەیڕەوکـەین
نیشتمانمان پێش ئـەخـەین



# خاوێنی

باخچە و کۆڵان وشەقـــــام
جێ ی هاتوچۆ ویاریـــــگام

وەك مـاڵ وقـوتابخـــــــانە
پـــاك وخــــاوێن وجـــوانە

یاسای نوێی ئەم سـەردەمـە
ئـەرکی شـانی سـەرجەمـە

تـەنها ژوور ومــــاڵی خـۆم
ئـەرکێك نی یــە لە ئـەستۆم

هــەرچیم بینــی کـەوتبوو
هــــەڵی ئەگرم خێـرا زوو

بـەبێ ورتـە و بۆڵە بــۆڵ
ئـەیخەمـە تەنەکەی خـۆڵ

ئـەمـە ئـەرکی شـــــانمە
شـــەقـام نیشتمــــــــانمە

بێـگانـەیـەك هــات بۆ شار
بۆ سەفەر، گەشت وگوزار

شــــــــارەکەمانی بینی
وابــە پـاك وخـــــاوێنی

وێنـەیــەکی جوان ئـەگرێت
لەلای خۆی هەڵی ئـەگرێت

ئـــەڵێت ئــــەم وێنە جوانە
شـارێکی کـــوردستـــانە



# ئاڵا و نەخشەی کوردستان



ئەی گەلانی ئاشتی خواز
بە نـــاسکترین ئــاواز

سرودێـــــکتان بۆ ئەڵێم
ئەمەوێت گوێ بگرن لێم

من نـەخشــەیەکم هەیە
جـوان و خنجیـــلانەیە

مــەلە، گـوڵـە، هــەتاوە
خـاکـە، چیایە، ئـــــاوە

گــەلـە، شـــارە، دێهاتە
دەستـی پڕ لـە خـەڵاتە

قــەڵای کـۆن و دێرینـە
بــەهاری پـرچ زێرینـە

بەر و بەرهــەمی زۆرە
ئـاڵا و پەرچــەمی خۆرە

لــەمێژەوە مـــــاندووە
تــەواو کـــاتی هاتووە

بـــە یاسای نێو دەوڵەتی
مـافی ڕەوای خـــۆیەتی

وەك ئـــــاڵاکــانی ئێوە
جـوان بـوەستێت بـە پێوە

بـڵند بشـەکێتـــــــــەوە
مێـــژووی بـگێڕێتــەوە

بــە ڕاست گۆترین شێوە
بـــۆ ئـــاڵاکـــانی ئـێوە

# بژی بژی کوردستان

شـــــارەکـــــانی کوردستان
خۆشەویستە لای هەمووممان

هـــــــــەولێر و سلێمـــــانی
مـــــــایەی شـــادی هەموانی

کــــــەرکوك و خـــــانەقینم
هــــــــەر بـــە خۆشی بتبینم

ئـــامێدی، دهـــــۆك، زاخــۆ
ســـڵاو ئـــــەنێـــــرم بـۆ تـۆ

هــەڵەبجەی شـاری گۆران
ڕووخـــــا قــەڵای زۆرداران

ســــــابڵاخ و سەقز و سنە
کــولــــــەکەی ڕۆحـــی مـنە

زۆرجـوانـە مـاردین و وان
کرماشـــــــان و هـەورامـــان

تــــۆش مەهـــــابادی قــــازی
بۆمـــــان بویت بە شـانــــازی

دیــــاربــەکــر و قـامیشـــلی
دەربەنـدیخـــــان وکـــفری

پــــــاوە وشنـۆ و بۆکـــــانم
گـلێنـــــەی چـاوەکــــــــانم

ئـــــــاواتـمـانـە یـەك بـگـرن
سنـوری دەستــــکرد بـبڕن

یـــــەك ئـــاڵا ویەك نشتیمــــان
بـژی بـژی کـــــــوردســــــتان



# سەیرانی قوتابخانە

ئـەمرۆ بـە چـەپـــڵـە ڕێزان
بـــە پـاس هـاتین بۆ سـەیران

خواردنی خۆشمـــــــان پێ یە
ســـەیرانـــگا چاوەڕێ یە

مـــەنجـەڵی پچوك پچـــوك
وەکـوخۆمـــان ئێسك سووك

چەند خۆشە کفتـــــە ویاپراخ
لـــــە گوێ چەم وکانی و باخ

گیزەی قۆری چای پشـــکۆ
قوڵپ ئـەدات لـە ســـــەر خۆ

کـرچە وقـرچـەی چـەرەسـە
پێبـکـەنـە و هیچ مـــەپرسە

لـــە ژێر دار چنـــارو توو
هەڵمـــاقۆ ئـــەکەین دوو دوو

هەندێك گوریس هەڵ ئەخەن
تـــاکو دیـــــلانێ بـــکەن

دوو مـــــامۆستاش لەولاوە
کـــــامێرەیـــان هێنـــــاوە

بــەبێ ئـــــەوی هیچ بڵێن
چك چك پـەنچـەی پیا ئەنێن

# سوپاس



سوپـــاس بۆ خۆر بۆئاسمان
سوپـــــاس بۆ هەورو باران

بۆ پـــايز و بـۆ زستـــــان
هـــاوين و بـەهارى جوان

سوپـــاس بۆشەو بۆ بەيان
بـــۆ مـانگ و ئەستێرەكان

سوپـــاس بۆ خاك بۆ گەنم
بۆ ڕەنـــگى گوڵ و شەونم

سوپـــاس بۆ بەرد و بۆ دار
ئـــــەبن بە كۆشك و تـەلار

ســــوپاس بۆ نان و بۆ ئاو
بـــۆ سێبەر و بۆ هـەتـــاو

سۆپـــاس بۆ تــەمەن و كات
بۆ هەرچى خزمەت ئــەكات

سوپـــاس بۆ ئاشتى خوازان
بۆ زانست و داهێنــــــان

سوپـــاس بۆ خوداى مەزن
ژيــــــانى بەخشى بە من

# ئاڵاکەم



پــەڕاو، پێنــووس و بۆیە
هاوڕێ ی منە و هی تۆ یە

ئێستــا کە دروست ئەکەم
ئاڵای کـــــوردستانـەکەم

سێ لاکێشـــە بـــەڕاستی
خۆریش لە نـــــاوەڕاستی

یـەکــەم سور بۆ شەهیدان
ئــەژین لـــە دڵی هەموان

دووەم سپی و بێـــگەردە
ئاشتی پەیـــــامی کـوردە

سێ یەمیش بۆیــە سەوزە
بەهەشتە لەم سـەرئەرزە

ئەوخۆرە گەشە جـــوانە
هیوایە، تێکۆشـــــــانە

کـــارتۆنێـکی بۆ ئـەبڕم
چوارچێورشی تێ ئـەگرم

کـەکۆلارەش هـەڵ ئەدەم
ئـــــاڵاکەمی تیا ئـەکەم

تا لەو ئاسمـــانە شــینە
وەکو پەلـــکە زێریـــنە

لەگەڵ کۆترە سپـیـەکـان
سروود بڵێ بۆژیـــــان

لـە سایـەی تۆ ئـــاڵاکەم
گـەش ئەبم باڵا ئـــەکەم

# بانگەوازی مناڵان



کـاربـەدەسـتـــانی جیهــان
ئــەمـــانەوێت بێ وەسـتــان

چی تـەقـــەمـــەنی و مینــە
لاببەن لــەم ســـەر زەمینــە

هەرچی پاشماوەی جەنـــگە
پینـــاسـەی زەبر و زەنــگە

پەپوولەین ئـــاشتی خوازین
نـــــامــانـەوێت بینــاسین

لـە جێ ی تـەلبـــەند وئەلغام
ئــەنێژین سـەدان نـــەمام

زەوی ئاشنـــای جوانی یـە
جێ ی نـەرمە گیا و کانی یــە

MAG دەی خێـــــــراکـە
سەر زەویمـــان بۆ چــاکـە

ئــــەمانــەوێت گوڵ بێنیـن
لــــە جێ ی مین بیروێنیــن

سوپاس وپێزانینی
خۆمان پێشکەش ئەکەین بە بەڕێزان
کاك کەمال ڕەووف ،کاك ئیبراهیم سالح
و کاك عوسمان قەرەداغی
بۆ هاوکاریان

زۆر خۆشحاڵین بە وەرگرتنی ڕەخنە و پێشنیاری بەڕێزتان بەم e-mailخوارەوەی
nene_bok@yahoo.se

